بە یارمەتی ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیری لاوانی
ناوچەی کوردستان لە چاپ دراوە

# چیرۆک

کەمال سەعدی









# وون بوون









پێشکەشە بە ـ

- باوکم
- دایکم
- دایکی ژاڵە و چیـا

ئەم جیهانە گەورەیە بۆتە مۆلگای جۆرەها مرۆڤ، هەریەکی ناوو ناتۆرەیەکیشیان بەسەردا سەپاوە ... بەهەندێکیان دەڵێن شێت و هەندێکی تر ژیر ... یان کەمژەل و ساویلکە و شتی تر ....

زۆرم بیردەکردەوە بەڵام بێسوود بوو ....

« وادیارە بە سانایی ناکەمە ئەنجام ! »

بەرێکەوت بەیانیەکیان زوو ، هێشتان خۆر ڕەنگە زەردە زێڕینەکەی نەبەخشیبووە ئاسمان ، ڕێم کەوتە بازاڕ .

مرۆڤێکی باڵابەرز ، وەك شتێکی لێ ون بوبێت ،لەوسەری شەقامەکە بەخێرایی دەهاتە ئەمسەری تریان و سەیرێکی ئاسمانی و دووایش زەوی دەکرد و ئەوکات بەهەمان خێرایی دەگەڕایەوە بەوجۆرە بەردەوام بوو .

لەسەرەتادا وامزانی شتێکی لێ ون بووە ، بۆیە بڕیارمدا یارمەتی بدەم و لەگەڵی بگەڕێم .

کابرا ئەم کاتەت باش ؟

هیچ وەڵامی نەدامەوە .

ـ لێی ناگیرێت ... یەکێك شتی لێوونبێت ، هۆشیشی وون دەبێت و ئاگای لەکەس نابێت .

دووبارەم کردەوە : ـ

ـ کابرا چیت لێ وونبووە ؟

چاوەڕێی وەڵامیم نەکرد و بەردەوام بووم لەقسەدا :

پێویستیت بە یارمەتی‌نیە ؟ ....دیارە شەرم دەکات ، واچاکە بەبێ پرس لەگەڵی بگەڕێم .... بێگومان بە دووکەس هەر

ئەبدۆزینەوە .
منیش لەگەڵ ئەو کەوتمە سەفارمەروای شەقامی ئاشتی ....
زۆر هاتم و چووم ، نەلەئاسمان وە نە لەسەر زەوی هیچی وام نەبینی کەمانی ئەمی بەسەرەوە دیاربێت، بۆیە بڕیارمدا بەجێی بهێلم و زیاتر یارمەتی نەدەم .
پێش ئەوەی پانی شەقامەکە ببڕم مرۆڤێکی تر بەڕاکردنێکی گەروێشکانی خۆی گەیاندەلام و دەستی کرد بە قاقای پێکەنین و هەرنەیبڕاندەوە ... ڕووم تێکرد و پێم گووت :
ئاکات تۆ دۆزیبێتتەوە... ئێمەش ئەوەندە پێیەوە ماندوبوین:
زیاتر لە پرمەی پێکەنینی دا .. ئەوەندەش لێم نزیك کەوتبۆوە هەرنەوەندە مابوو بمخاتە ئامێزی .
سەرم لێی سوڕما .... کەوتمە بیرکردنەوە : (نەدەیناسم نەدەمناسێت . کەچی بەپێکەنینەوە بەرامبەرم قوتبۆتەوە ... )
وام بەباش زانی کە زلەیەکی لەوزینەیی بسەرەوێنمە بناگوێی و پێکە نینەکەی بڕەتێنم ... نەمکردە کەمتەرخەمی بەدەستە قورسەکانم زلەیەکی موستەحەقم لێدا ... هەرخۆشی لە گوورە نەبرد .....!
( ئیشێکی خراپم کرد ... بەلام وامنەکردبا لەکۆڵم نەدەبۆوە ).
ئەمبارەشیان زیاتر لەجاران دەستی پێکردەوە و بەدەستەکانیشی ئیشارەتی بۆدەدام ...
(چی لێم دەوێ ... بۆچی هاتمو دووچاری چی بووم ؟ ! وام بەباش زانی کەچەند زلەیەکی لەسەریەکی لێبدەم هەتاباش گەرمی بکاتێو بەرۆکم بەربدات ...دووبارەو سێبارەم کردەوە ...

هەر لێیدەداو زیاتر پێکەنینەکەی گەرم دەکرد ... تا وای لێهات دەستەکانم توانای وەشاندنی تیا نەما ..لە حەزمەتی دەستەکانم لەقاقای پێکەنینم داو نەمدەزانی بەخۆم پێدەکەنم یان بەوان. ئەوجارەیان ئەویان دەستیکرد بە گریاتێکی بەتەوژم و خۆی زلەی لە ڕوومەتەکانی دەدا

بەدیتنی ئەم دیمەنە سەیرە زیاتر پێکەنینم دەهات و دەمەویست دیج نەبێت پێکەنینەکەم بوەستێنم و بەڕێی خۆمدا بڕۆم ، کەچی زیاتر دەنگم بەرز دەبۆوە .

( بۆ لەخۆی دەدات ... بۆ دەگریەت .. بۆ بەدەستی من گریانی نەدەهات ئێستاش بەم نەرمەزلانەی خۆی بەگوڕ فرمێسک لەچاوەکانیدا دەچۆڕێتەوە ....) ئەم بیرانە نەیاندەهێشت پێکەنینەکەم بوەستێت ... کەوتبومە گێژەنی بیرکردنەوە و ئاگام لەوەنەبور کە کۆمەڵێک منالی پاڵاوەفرژشی چەقاوەسوو دەوورەیان داوم ... هەرئەوەندەمزانی دەستیان کرد بە چەپلەو هۆیها ... هۆیها ... حەبەقاقا ....

وای لێهات کە هیچ ئاگام لەخۆم نەمێنێت و بکەومە جیهانێکی ترەوە ... جیهانی وون بووەکان .

مێشکم پڕبوو ، سەرم لێ شێوابوو ، خۆشم نەمدەزانی شێتم یان عاقڵم ... ئەگەر عاقڵبم بۆ چەپڵەم بۆلێدەدەن و هۆی هام بۆ دەکەن .. وەئەگەر شێتیش بم ، چۆن تائێستا بەخۆم نەزانیوە ؟!

بیری ئەمشتانەم دەکردەوە ... منالانیش بەردەوام بوون .... زنجیرەی بیرکردنەوەم پچڕا ... لەگەڵیان کەوتمە چەپلەڕێزان

لە خۆی هاگردێ لە جەمەڵاڵا ••• شێتە ••• شێتە ••• چەند پیاوێ کەنجی بازاڕ هەبوون ، دەوریان دابوین و تەیاندەزانی کامەمان شێتین ••• لەناکاو قوتابیەکم بۆ پەیدابوو ، خوا خێری بنوسێت ، باوەشی بەزەیی بۆکردمەوە و خۆی کرد بەناو چاوی خەڵکەکەو لێم هاتە پێش و گووتی :

ماموستا ••• ئەوەتۆی ••• خێرە کەوتویتە ناو باوەشی ئەم دەوشێتە و سەرزاری ئەم جەماوەرە ؟

ـ رۆڵە ئەگەر تۆش دوور نەکەویتەوە ، وەکو من وون دەبیت و خۆت ناناسیتەوە ••• ئەوە تۆ منت ناسیەوەو رزگارت کردم بەڵام تۆ وون بیت کێ دەتناسێتەوە ••• هەروەکو ئەم ، دوو ویڵە دەبینیت ، ناویان بەشێت دەرکردووە ، زۆریش تەمابوو ناوی منیش بچێتە پاڵیان ولەبیرخۆم ببەنەوە ، هەروەکو ئەوانەیان لەبیرخۆ بردۆتەوە ••• یەکیان بەخۆشی نازانێت چی لێ وون بووە ! بەڵام من دەزانم چی لێ وون بووە ، منیش هەمان شتم لێ وون بوو ، بەڵام تۆ بۆت دۆزیمەوە •

قوتابیەکە بەسەرسامیەوە :

ـ چۆن ماموستا چی لێ‌وون بووە ؟!

ـ وون بووە و خۆی نادۆزێتەوە •

١٩٨٣

لە ژمارە « ٩٦ »ی گۆڤاری بەیان بلاوکراوەتەوە

١

هاوینێکی دوورو درێژ چاوەڕوانی پێگەیشتنی باخچەساواکەیان بوون ... هەموو ئێوارانێك باسی هات و نەهاتی‌ی ساڵەکەیان دووبارەو سێ‌بارە دەکـردەوە ، هەتـا وای‌لێهاتبـو منالآنیشیان لەجیاتی لای‌لایە بەم‌قسانە وەنەوزەیان دەدا ....

٢

باخچە پێگەشت ........ ٤

هەموو بەیانیانێك کە بەرەو باخچەکەیان دەچوون بۆلێکردنەوەی بەروبوومە پێگەیشتوەکەی ، دەیاندیت ئەوشتانەی دەست‌بدەن بۆ خواردن قرتێندراوە و پێشێل‌کـراوە ... ئـەوەی کاڵیش بێت بەبرکیەوەماوە . تەنانـەت ئـەو شتیانەی کـە لەژێـر لیش هەڵدرابوونەوە ، سیخوڕی بەدفەڕ خۆی کەیاندبوونێ‌و لەت‌و پەتی کردبوون ... ئەوانەی بەدەستەوە مابوون تەنیا کودووە ئاوبە پایزیەکان بوون ، کـە تـولەیان وەك لاولاوە دەستیان خستبووە گەردەنی تاشەبەردەکانی ئەو قەدپاڵەو بەرەو لێواری ڕووبارەکە درێژ ببوونەوە ... باس باسی گۆڕدو بوو ، کە شاڵەهای ساڵە ئەم

ئاواییەشتی وەهای بەخۆیەوە نەدیتبوو • لەوانەیە بە پنجێکــی خێزانێك گوزەران بکات • کەچی کودووەکانیــش گوڵیان دەگرت و هەڵدەوەرین • زۆرجاران دڵی خۆیان دەدایەوە و دەیانــگوت :

ـ بەری سەرەتا بــۆ هەڵوەرینــە ••• دووایــی باشــی دەبێت • ماوەیەك بەسەرچوو ••• بگرە گوڵگرتنەوەکەشــی بەخۆیـــدا نەدیتەوە •

ئەم هاوینە لەم باخچەیە زیاتر هیچی تریان شك نەدەبرد بۆ دابینکردنی پێویستیەکانیان لە تەماتەو میوە • بۆیە پێویستی بە چارەسەریەك هەبـــوو •

بڕیاریاندا ، شەوێك بچنە ژووانی سیخوڕەکە

ڕۆژ ئاوابوو ••• تاریکی چارۆکەی بەڕووی ئاواییەکە دادا •• بەخێرایی نانیان خاردو بەرەو زەوی نزار کەوتنەڕێ •••••• لەگەڵ گەیشتنە جێ ، چاڵێکیان لەبەردەرگای پەرژینی باخچەکە هەڵکەندو بە پووش‌و دڕك‌و داڵ سەریان گرت •

بەوهیوایە سیخوڕەکە لەکاتی هاتنەوەیدا بکەوێتە ناوی و بەدار بکەونەگیانی و تۆڵەی ئەم زیانە زۆرەی لێ بکەنەوە •

ـ گوشتنی سیخوڕیش خــراپ نیــە ••• گۆشتەکــەی خــۆشە ! ماوەیەکیش بووگۆشتیان نەخواردبوو ، چونکە تەنیا چــوارسەر ئاژەڵی شیرداری بێچوداریان شك دەبــرد ، ئــەوانیش لــەبــەر ماست‌و پەنیرەکەی دەستیان لێ بەرنەدەبوو •

ڕاوەشکاریش هەرهیچ ! ئەم ساڵەیان پیاوەکانی ئاوایی خولیای چەڵتوك چاندن ببون‌و بەلای ڕاوەشکاریدا نەدەچوون •

بیری ئەم شتانەیان دەکردەوە ••• شەوێکی سامناك بــوو •••

لووره‌ی گورگ و قیڕه‌ی بۆق و خوڕه‌ی ئاوو خشه‌ی گیاوگۆڵ و خشپه‌خشپی که‌روێشکه کێویانیش تێکه‌ڵ به‌یه‌ك ببون‌و شه‌ویش هه‌رنه‌ده‌بڕایه‌وه ·

پلکه‌ئایش و بایزی کاکه‌براش له‌ناو که‌نده‌ڵانه ته‌نگه‌به‌ره‌که‌ی بنار په‌رژینه‌که خۆیان خزاندبووه باوه‌شی یه‌کتر و به‌هه‌ردوو ده‌ست مێشوله‌یان‌له ده‌م‌و چاویان پاس ده‌کرد ·

ئه‌م شه‌وه‌یان هه‌تا به‌یانی خه‌ونه‌خزایه چاویان ···· ئاسمان تاریك و ڕۆن بۆوه · وه‌کو سیخوڕ شتێکی له‌م ژوانگرتنه‌ی پلکه‌ئایش زانیبێت ، ئه‌م‌شه‌وه‌یان هه‌ر به‌ولاشدا نه‌هات ·

به‌ناهومێدی گه‌ڕانه‌وه ئاوایی ·

هه‌رچۆن بێت ئه‌م ڕۆژه‌شیان به‌بژارکردنی تووتنه‌که به‌سه‌ربرد · خۆسه‌ر ئێشه‌ی توتنیش له مه‌سه‌له‌ی سیخوڕه‌که پیستره ! هه‌موو ڕۆژێك بۆڵه‌یان بوو له‌ده‌ست مام‌سۆفی ، له‌سه‌ر جۆگه‌کانیاوه‌که‌ی ژوور باخچه‌که‌ی مام‌سۆفی··· توتنه‌که‌ی هه‌تابڵێی سه‌وزو جوان و گه‌ڵاپان بوو ، به‌ڵام تۆ بڵێی له‌کاتێکی وه‌هادا ئاویان له‌سه‌ر نه‌گرنه‌وه که ببێته هۆی ووشك بوون و تیژبوونی ! !

ئه‌مه‌شیان هه‌رخوا به‌خۆی ده‌زانێت ، چونکه مام‌سۆفی بیانوو به‌تری خۆی ده‌گرێت !

ئێواره‌داهات ··· پلکه‌ئایش‌و بایزی کاکه‌برا نانیان خواردو دووباره به‌ره و باخچه‌که‌یان که‌وتنه‌ڕێ ··· به‌ڵام ئه‌نجاره‌یان سه‌گه‌بۆره‌شیان له‌گه‌ڵ خۆیان برد ··· سه‌گه‌بۆره مه‌گه‌ر بێچوی به‌شکۆنه‌بێت : نێچیر له‌ده‌می شێر ده‌ردێنێت · به‌مجۆره خۆیان گه‌یانده‌جێ و که‌وتنه‌وه ژووانی ،

پلکه ئایش ڕووی کرده بایزی کاکه‌برا و پێی گوت :

ـ ئەگەر ئەمجارە سەگەبۆرە سیخوڕەکەمان بۆبگرێت ، بەیانی خواردنی گۆشتیشمان دەبێت و ماڵی ئاواییش لەم خواردنە خۆشە بێبەش نابن ٠٠٠٠ ئەودووماڵگەی ماویشە بەشی ئێمە تەماتەو مێوەمان دەبێت ٠

ئەستێرەکان ئاسمانیان تەنیبۆوە و چاوەڕێی دەرکەوتنی مانگ بوون ٠ پلکە ئایشیش خەو چاوی دەبردەوە و نەرمە باوشکی دەهات ٠٠٠ لەپڕ سەگەبۆرە لوورەیەکی لێوەهات و خۆی هەڵکوتایە ناو باخچەکەو کەوتە حەپەحەپ کردن ٠٠٠٠

پلکە ئایش ڕاچڵەکی ! دەتگوت لە حەوت باری خەودا بووە٠ مشتێ ئاوی بەچاوی داکرد و دەستی دایە داربەڕووە بەترەلۆزەکەی تەنیشتی و بایزی کاکەبراشی بەئاگاهێناو بە دووقۆڵێ کەوتنەکیانی سیخوڕەکە ٠ حەپەحەپی سەگەبۆرەش ئەژنۆی سیخوڕی شکاندبوو ٠ زۆری نەمابوو ئاسمان ڕووناك ببێتەوە ٠٠ سەگەبۆرە خۆی لە سیخوڕەکە کێشایەوە ،بۆ ئەوانی بەجێ هێشت ٠٠٠ سەگەبۆرە زۆر ڕاوەشکاری پێ کرابوو ، بۆیە شارەزاییەکی تەواوی وەرگرتبوو ، نەیدەویست گۆشتەکەی پیس بکات ٠٠٠٠٠ بەڵام هێندەی پێنەچوو سیخوڕی بەدفەڕ تاهێزی لەگیان دابوو خۆی ڕاشەقاند و پەڕێکی تیژی لە پلکەئایش گرت و بەباڵەشۆڕەی خست و بۆی تێ قووچاند ٠ هەرچەندە پلکەئایش لەبەرئێش و ئازاری قۆڵی ئۆقرەی نەبوو ، بەڵام قەت ڕزگاربوونی ئەم تێچیرەی لەبیرنەدەکرد ٠ بایزی کاکەبراش زۆر خەمگین بوو بەزامدار بوونی دایکی ، بەخەمناکیەوە پێی گوت :

قۆڵێکیشت لەسەر دانا و هیچیشمان بەهیچ نەکرد !
پلکەئایش بەزەردە خەنەیەکەوە پێی گوت :
ـ رۆڵە . ئەوەی ئێمە ویستمان هاتەدی ، تەنیا لەخواردنی لاشەکەی بێبەش بووین ٠
بایز بەسەرسوڕمانەوە :
ـ چۆن دایەگیان ؟
پلکەئایش لە بایز هاتەپێش و دەستەزامدارەکەی خستە سەرشانی و پێی گوت :
ـ کوڕم زامداربوونی قۆڵم بەفیڕۆ نەچوو! بزانە هەتا ئەم هاوینە دەبڕێتەوە جارێکیتر شوێنەواری ئەم سیخوڕە نابینینەوە ٠٠٠٠
وامان لێیەدا ، وازوو لەبیری بکات ٠
باخچەکەشمان هێشتا ئاوایە و بەبەریەوە ماوە کوڵی نوێ دەگرێتەوە و بەشی هەرسێ ماڵێ ئاواییەکەمان بەردەگرێت ٠
ـ ٢ / ١ / ١٩٨٣ ـ

**تێبینی : ـ**
لەژمارە (١٦)ی گۆڤاری (کاروان) بلاوکراوەتەوە

# لە چاپخانەی کەوبازاندا

یەکەم جار بوو ڕێی بکەوێتە شار ٠ ئەم ڕۆژەیان لە یەکێك لە ئوتێلەکانی نزیك قەیسەری دابەزی بوو ٠٠٠ بەیانی زوو لەخەو هەڵسا ٠٠٠٠ وای بە باش زانی بچێتە مزگەوتی گەورەو نوێژی بەیانی لەوێدا بکات و ژەمی بەیانیش لە خەم بخات٠٠٠ بازاڕێکی کش و مات ٠٠٠ لەم سەرو ئەوسەری شەقامەکان لە عەرەبانچیە نۆکاوفرۆش و نیسکێن فرۆشەکان و تاك و توکیش چایەچی گەڕۆك و مرۆڤی سەڵتی وەکو ئەو زیاتر هیچی تری لێ بەدی نەدەکرا ٠٠٠٠

هێمنی و ئاسودەیی باڵی بەسەر شاردا کێشابوو ٠٠٠٠ چەند هەنگاوێکی مابوو بگاتە لای مزگەوتەکە ،دەنگی قاسپەی کەوی چیایی خۆی هەڵکوتا ژوورژۆچکەی گوێچکەکانی ٠٠٠٠٠ حەپەسا ٠٠٠ هەڵوێستەیەکی کرد٠لەبەر خۆیدا گوتی :

هەڵبەت ئەم قاسپەیە لە ڕادیۆ دێتە دەرەوەو لە گوێما چەخماخە دەدات ٠

هەمووكەس نەیدەوێرا خۆی لێ نزیك بكاتەوە.لەهەمووی سەیرتر ئەوە بوو كە شەڕەكۆتریشیان لەگەڵ نەدەكرد بەلام بەنرخێكی زۆر لێیان دەكڕی .
خۆی لێ نزیك كردەوە و بەئەسپایی چرپاندیە ژێر گوێی :
ــ ئەم جووتە كۆترە تەقلەبازەت فرۆشت . ئەی بۆبەیانی چی دەهێنیتەوە ؟
ــ كۆتری ترم لەماڵەوە هەیە .
ــ ئەوانیش باشن ؟
باشیو خراپییان لەدەست خۆمە ... چاك پەروەردەیان دەكەم .
چۆن كۆتاییان نایەن ؟
ــ هەتا جووتێك پەروەردە نەكەم ، جووتێكیان نافرۆشم.....
من خۆم لەبازاڕیان دەزانمو نانم لەسەریانە .
ــ چــۆن ؟
ــ هەرچەندە بەڕۆژ فەرمانبەرم سەرەڕای ئەوەش مووچەكەم بەشم ناكات بۆیە ئەمەم كردۆتە پیشەی سەرلەبەیانیانم .
ــ چۆن دووكار دەكەیت ؟
ــ زیاتریش . ئێوارانیش كەروێشك دەفرۆشم ..........
ــ ئەی جێگات هەیە ؟
ــ خانوەكەم كرێیە ، ژوورێكیان خۆم تیــایمە و ژوورەكـــەی تریشیان ئەمجۆرە شتانەی تیا پەروەردە دەكەم ..........
لەمقسانەدابوون ، بووە قاقای پێكەنینو فیكەو چەپڵەڕێزان ...
بە سەرسوڕمانەوە . ڕوی كردە خەڵكەكە و گوتی :
ــچی بـــووە ؟!
ــ لە ئەنجامدا كەوەكەی قادر كەوبازیش بەزی

ــ بۆ کەوەکەی ئەو چی بوو ؟!

ــ کەونەمابوو ، نەیبەزاندبێت! خۆ کەو نەبوو ۰۰۰ کەڵەشێرێك بوو بۆ خۆی !

ــ ئەی چۆن بەزی ؟

ــ کەوەکەی حسێنەفەندی کەوەکەی مام عەلی بەزاند و تووکسی بەسەریەوە نەهێشت ، کەئەویش بینی ترسی لێ نیشت و دەستی کرد بە خوێندنو هەر ئەوکاتیش حسێنەفەندی گرەوی لەگەڵ قادرکەوباز کرد کە شەڕەکەوی لەگەڵ بکات ۰۰۰۰ ئەوەی ڕاستی بێت قادر کەوباز ئاگای لەوەنەبوو کەسەری قەفەزەکەیان هەڵداوەتەوە ۰۰۰ بۆیە گرەوەکەی کردو کەوەکەی بەزی ۰۰۰۰ بەبەزینی کەوەکەی قادر کەوباز شەڕەکەوێنو کۆترێنەی ئەوڕۆژەیان کۆتایی پێهێنا و ڕۆژیش لە زەردیدا بوو بۆیە هەرکەسە و قەفەزەکەی خۆی گرتەدەست و بەرەوماڵ گەڕانەوە ۰ تەنیا خۆی و قادرکەوباز مانەوە ۰ چووە پاڵی و وای بەباش زانی کە چەند پرسیارێکی لێبکات ۰ ڕووی تێکرد و گوتی : نەمدەزانی لێرەدا بازاڕی واهەیە ۰

ــ بۆ خەڵکی کوێی ؟

ــ قەدپاڵی چیای قەندیل ۰

ــ دیارە تۆش کەوت هەیە ؟

ــ بەڵێ کەوی باشم هەیە تائێستا هیچ کەوێك نەیبەزاندون ۰

ــ یەك ئامۆژگاریت دەکەم ، قەت ئارەزووی کەوبازیت نەبێت ۰۰ من تاکەکەس بووم لەم ناوچەیەدا ، خاوەنی کەوێکی کەڵەشێری وەهابم ، کە کەوی هیچکەس و ناوچەیەك لەبەریدا خۆیان ڕانەگرتبێت ۰ هەربۆیەش ئەم چایخانەیەم بەچایخانەی کەوبازان

دەنگی داوەتەوە .

سەرەڕای ئەوەش دەبینی ، کەوی کەسیشرنا ، کەوەلە یەکی وا کەوکەی منی بەزاند و ئابڕوی منیشی برد ... ئێستا گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە هەرکەوێك هاوکەوی خۆی ببەزێنێ خۆشی هەردەبەزێت .

ڕۆژ گەیشتە ناو چایخانەکە و ئەمانیش هەر بەم باسانەوەبوون هەڵساو خواحافیزی لەقادر کەوباز کرد و بەرەو کەبابخانە کەوتەڕێ .

ـ ١٩٨٢ ـ



ـ ١ ـ

چەند ڕۆژێکی کەمی مابوو بۆ تەواوکردنی تـاقـی کـردنەوەی سەری‌ساڵ .... نەیدەزانی بیر لە دەرسەکانی بکاتەوە یـــان کاردۆزینەوە ...هەموو ڕۆژێك دەکەوتە ناو گێژەنی خـەیاڵی هاوینەهەوارەکان ... تازە لە هەڕەتی لاویدا بوو ... کاوەی دراوسێ یان فەرمانبەری هاوینەهەوارەکان بوو ، بەڵێنی ئەوەی پێدابوو ، ئەم هاوینە ئاگـای لێ‌بێت‌و مووچـەیەکی کـاتی بـۆ ببڕێتەوە ....

ـ ٢ ـ

دووا تاقی کردنەوەی بەوانەی مێژوو کۆتایی پێهێنا ...... بەڕووێکی گەش‌و دڵێکی فراوانەوە بۆلای کاوەی‌هاوڕێی‌ڕۆیشت داوای نامەیەکی لێ‌کرد بۆمەبەستی دامەزراندنی .. بەوەنەبوو کاوە فەرمانبەربوو...خۆ هیچی بەدەستەوەنەبوو لەئیش‌وکاری پرسگە زیاتر ... زۆری بەشان‌و باڵی خۆیدا هەڵگوتبوو، گوایا

ـ چۆن بۆی نانووسم ٠٠ ئەو کـە داوای شتێکم لێدەکـات دوو ئەوەندە جوێنم بۆ ڕەوانە دەکات ٠٠٠٠

ـ کەواتە حەقی خۆیەتی ٠٠٠٠

نامەکەی تەواو کردو خستیە ناو زەرفێك و بەکەتیرە دایخستو دایەدەستی : ـ

ـ ئەمە بۆ ئەندازیار ڕەحیم ببەو بیدەرێ ٠٠٠ ئەگەرخۆشی لەماڵ نەبوو ، بیدە دەست خێزانەکەی و چـاوەڕێی وەڵامەکـەی بکـە ٠

ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان بوو ٠٠٠ کیانی لەناو ئارەقـە شەڵاڵ ببوو ٠٠٠ نامەکەی خستە ناو تەنکەی باخەڵی و بەخێرایی خۆی گەیاندە ماڵێ ٠٠٠٠ چاکەت و پانتۆڵە چارلستە نـوێکـەی دەرهێناو کردیە بەری ٠٠٠ مشتێ قۆڵانی و گـوڵاوی تیرۆسـی پڕژاندە سەرو ڕووی ٠٠٠٠ گوڵە باخێکی سـووری لـــە نـاو گوڵدانەکە دەرهێناو وەك قوتبەدین بە دەبووس لەیاخەی گیرکرد و ڕۆیشتە دەرەوە ٠٠٠٠

خۆی گەیاندە گەراج ٠ ٠ ٠ ئۆتۆمۆبیلێك بـۆ دوو نەفـەر وەستابوو ٠٠٠ خۆی تیاهاوێشت و پارەی دوو نـەفـەری دایێ و ئۆتۆمۆبیلەکە بەڕێ کەوت ٠٠٠٠ هەرچەندە سەری ڕەش ڕێگایەـ کەی دوور نەبوو ، بەڵام ئـەو هـەر لـەوکاتەی بەسەرکـەوت ، کەوتە گەرمەی خـەیاڵی و بیری کۆمەڵێـك شتی دەکردەوە ٠٠٠

«بە چاودێر دادەمەزرێم ٠٠٠٠ پارەیەکی باشم پێدەبـڕێت و ئەم هاوینەش لەوسەیرانگا خۆشەدا بەسەردەبەم ٠٠٠ هاوینی پار کرێکاربووم و قوڕکاریم دەکرد ٠٠٠٠ لـەچلـەی هاویندا قاپـە قوڕم بۆ وەستا عەلی بەسەر دەخست ، بەڵام ئەم هاوینەیان دەبێت

کوڵ لەسەر یاخەم بدەم و بخزێمە ناو جیهانی ئەوین ۰۰۰۰» ۰

گەیشتە جێ ۰۰۰۰خۆی گەیاندە ماڵی ئەندازیار ڕەحیم۰

پەنجەی لەسەر زەنگەکە داناو هەڵی نەگرت ۰۰۰۰ دەرگا کرایەوە ۰۰۰ کچێکی شۆخ‌وشەنگ چاوەکانی ڕووناک کردەوە:

ــ ئێرە ماڵی ئەندازیار ڕەحیمە ؟

ــ بەڵێ ۰

ــ ئەم نامەیەم بۆ هێناوە ۰

ــ خۆی دەشوات ۰۰۰ نامەکەم بدەرێ و دووای نیو کاتژمێر بۆ وەڵامەکەی سەربدەوە ۰۰۰۰ دەشتوانی لەژێر سێبەری دارەکانی ئەو بەرامبەرەمان چاوەڕێ بێت ۰

بەخێرایی لەوسەری شەقامەکە دەچووە سەرەکەی تری هەرهەنگاوێکی کردبوو بە دووان و وەکو شارلی شاپلن قاچەکانی قۆشمەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد و بەدرێژی شەقامەکەیان دەپێوا . لەگەڵ ئەمەشدا بیری خێراخێرای دەکردەوە ۰۰ ئەو نیوکاتژمێرە لێی ببوو بە دووارۆژی تاقی کردنەوەی و کۆتایی نەدەهات۰۰۰ ناوەناوەش ئاوڕێکی لەبەردەرگاکەیان دەدایەوە و دەستی بۆ قژی دەبردەوە و ئیشارەتی بۆ کچە شۆخەکە دەکرد و بەڕویدا پێدەکەنی ۰۰۰۰

ئەندازیار ڕەحیم هاتەدەرەوە ، بانگی کرد ۰۰۰ بەپەلە خۆی گەیاندە لای ۰۰۰ بەڕێزەوە بەرەو هۆڵەکەی کشاند ۰۰۰۰ شەربەتێکی زەردیان لەبەر دانا ۰۰۰ هەڵیگرت کە دایچۆڕێنێتە ناو گەروی بەڵام ئەندازیار ڕەحیم پێی گوت : ــ

ــ ئابیرم کەوتەوە۰۰۰ڕۆڵە مادامەکی تۆئەوەندە هەژاریت‌و هیچ خزم‌و کەسێك شك نابەیت‌و دایکت چاوی لەدەستی

هاوینەهەواری سەری ڕەش لەژێر دەستی ئەودایەو بەڵێنیشی پـێ دابوو بۆیە نەیتوانی خۆیبێنیو بباتەوە ••• کەوتە ئەمری واقع•
جگارەیەکی بەغدای خستەسەر لێوەکانیو تاتینی لەبەردابوو مژێکی درێژی لێدا•••چەند قومێکی لەسەریەکیشی بەدوودایەوە •••••• چاوەکانی بڕیبوونە گۆشەی ژوورەکەو وەکو چـاوی قرژاڵ لەناو قۆزاخەکەیدا چەقیبوون چاووی بڕیبووە دەمـی کاوە و چاوەڕێی چەند ووشەیەك بوو •••
بەرەبەرە جگـارەکـە دەسـوتاو سۆتەکی دەکـەوتـە سـەر مێزەکە هەتا وای لێهات ئاگرەکـە گـەیشتە سـەر فیلتەرەکـەو کوژایەوە •••• بەڵام ئەو هـەر لەشوێنی خـۆیـدا مابـۆوە و نەیدەزانی چۆن خۆی ڕزگار بکات •
کاغەزێکی سپی فۆلسکابی ڕاکێشایە بەردەمی و دەستیکرد بە ڕازاندنەوە و نەقشکردنی •••
لەخۆشیا هەرئەوەندەبوو باڵی نەدەگرت و نەدەفڕی •••• بیری دەکردەوە کە دەبێت چی بۆ بنوسێت و چی پێبڵێت •••• «واسیدە بۆ ڕۆژی وا نەبێت ئەی بـۆ کـەی دەبێت »•••زۆری حەزدەکرد لە ناوەڕۆکی نوسینەکە ئامادەبێت بۆیە دڵی کـەوتـە جرتو فرتو وەسویسە «پێی بڵێم نەڵێم•••»خـۆی پێ نەگیراو ئاخیری هەر گوتی : ـ
ـ کاوە ئەم تەوڕاتە چیبوو هەر نەبڕایەوە ؟
سەری هەڵبڕیو بەزەردەخەنەیەکەوە : ـ
خۆ هەروا بەئاسانی پێی ناکەم، نابێت هـەندێك جـوێنـ کاریشی بکەمو بەشەق پێی بکەم !!
ـ نا ئەمجارەش لەبەرمن شتی خراپی بۆ مەنووسە •

تۆیەو خوشكو براكانیشت هەروا، بۆ ئەم جلو بەرگە بەنرخەت كڕیوە ····ماشەللا بۆنو بەرامیشت ڕۆژە ڕێیەك دەڕوات··
··باشتر نەبوو ئەوەی لەوانەت خەرج دەكـرد بەپارویەك نانت بەاباو ژیانی خۆتان پێ دابین بكردبا ····
····ئەوە لەلایەك ، لەلایەكی تریش ڕۆڵە خۆ تۆ منـاڵ نیت ، بۆچـی شـەرم دەكـەیت ···· چ پێویست بـەم نووسینە دەكات یەكێكی نەناس بۆمی بنوسێتو پێم ڕابگەیەنێت ···كـە تۆ بەمشێوەیە هەژارو بێدەرامەتی ···· چـەنـدڕۆژێك پێش ئێستا بهاتایو باسی حاڵی خۆتت بۆبكردمایە ئەوادامدەمەزراندی و مووچەیەكی باشیشم بۆت دەبڕاندەوە · بـەلام ئێسـتا هیـچ جێگای پێویست شكنابەم چونكـە ژمارەیـەكی زۆر قوتابیـانم دامەزراندووە · هیوادارم دڵگیرنەبیت ·
كەئەم ڕستانەی ئەندازیار ڕەحیم لەناو گوێیا چەخماخەیان دا وەكو بتو سەنەمی لێهاتو زمانیلاڵ بوو و قورگی قوڕقوشمی تێكراو دەستی لەسەر ڕوویگلاسی شەربەتەكە سڕبووو ڕووناكی گلێنەی چاوەكانی ئاوابوو و تارایەكی شەرم بەسـەر ڕوویـدا هەڵكشا ··· تەزوویەكی سارد بەلەشیا هات كچەشۆخەكە هاتە ژوور سەری و پێی گوت : ــ
ــ فەرموو شەربەتەكە بخۆوە هەتا گەرم نەبووە ؟
ڕاچڵەكی ···· دەتگووت لەسەر كورسی تاقیكردنەوەیەو قوپیای لەدەست گیراوە ، ئەوها سـەری لێشێوا ···· تـەنیـا ئەوەندەی گوت : ــ
ــ سوپاس ، دڵم نایبات · ئەوەندەی گووتو ماڵئاوایی لـێ

کردن‌و چووه ده‌ره‌وه · بڕیاری‌دا که بگه‌ڕێته‌وه هـه‌ولێرو ئـه‌م هاوینه‌شی هه‌ر به‌قاپه‌قوڕ کێشانه‌وه به‌رێته‌سه‌ر ·

ـ ۱۹۸۱ ـ



ماوەیەکی زۆر بوو هاوڕێیەکەی بەجێی هێشتبوو ...
هەموو ڕۆژێك یادی جارانی دەکردەوەو لەگەڵ خۆیدا دەیگوت :.
ـ بۆخۆی لێیدا ، جێگای زۆر خۆشە، خۆ وەکو من لەسوچی
شارێکی دوور لە هەموو شتێك نەکەوتووە .... پایتەخت هەر
ناوی گەورەیە ، جا دەبێت خۆی چۆن بێت . ژیانی ئەوێ
تایبەتیە ، بگرە مرۆڤەکانیشی وەکو ئێمەنین ، خاوەندی بیرو
باوەڕو زەوقێکی تایبەتینە ، هەڵبەت ئەو دیمەنانەی لەسەر
شاشەی تەلەفزیۆن دەیانبینین بەشێکن لەوشوێنانەی مەردمێشکی
پێ دەحەسێتەوە ...شاری یاریو دوورگەی ڕاشدیەو شتی تریش،
... بڵێم چی ... مەگەر ئەو هەربەخۆی بزانێت کە چەند
خۆشن .... ماوەیەکی کەمیش نیە ... چوار ساڵ کەمنیە بۆ
مرۆڤ بتوانێت لەبێکەسیو شوێنێکی وەهادا خۆی بەڕێوەبەرێت
... ئەگەر منیش لە بەغا بوومایە ئێستا لە بارەگای ڕۆژنامەو
گۆڤارە کوردیەکان نزیکدەبوومو دۆستی بەنرخترین گەنجینەی

ئەدەبی دەبووم ..
...ئای کە چەندخۆشە مرۆڤ لەجێگای وەهابێت .
هەموو ڕۆژێك لە گەرمەی ئیشکردن و بیرکردنەوەیدا جلّەوی خەیاڵی دەبەزی و هەمان شریتی سینەمایی پایتەختی دەهاتەوە بەر ڕۆشنایی چاوەکانی .
بەیانیەك تازە سەرەتای دەوام بوو لەسەر کورسیەکەی دانیشتبوو سەری خستبووە ناو لەپەکانی . بیری لەسەردانی هاوڕێکەی دەکردەوە .. لەناکاو دەنگی دەرگای ژوورەکەی هات و تەتەری دائیرەکەیان بەژوورکەوت ، نامەیەکی قەڵەوی خستە سەرمێزەکەی .
زۆر دڵشاد بوو ، پێش هەمووشتێك ڕووانیە نووسەری نامەکە.. بزەیەك هاتە سەرلێوەکانی .... هەرزوو دەستی خستەوە گیرفانی و دینارێکی دەرهێنا ، خستیە ناودەستی تەتەرەکە .
نامەکەی کردەوە ... وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگ لەسەرەوەی کاغەزەکە بوو ... کراسێکی نیوقۆڵ و پانتۆڵێکی ئاسایی و دیمەنێك لە شەقامەکانی بەغا ... سەری سوڕما :
ـ بەم چلەی زستانە و کراسی نیوقۆڵ ! دیارە لەوێ مۆدێلە .. لەوانەیە لەوێ تازەسەرەتای پایز بێت .... جا بۆ زستانی پایتەخت ئەوە نەخوازێت ؟ هەموو شت دەبێت ،
کە گوتت پایتەخت دەبڕێتەوە . مرۆڤی ئەمجۆرە شوێنانە چارە بۆهەموو شتێك دەدۆزنەوە ، جاکراسی نیوقۆڵ لەزستانیشدا بۆیان دەبێتە قاپووت .
وازی لەم بیرانە هێنا .... وێنەکەی خستە لایەکی مێزەکەو کەوتە خوێندنەوەی نامەکە :

«برای ئازیزم من زۆر بەختەوەرو دڵشادم بە ژیانی ئێستام ٠ ٠ لەو پەڕی خۆشگوزەرانیدا دەژیم ٠٠٠ ئەمەش ئەدرەسەکەمە ـ بەغائوتێلی کاسب ـ هیوام وایەکە سەردانێکمان بکەیت ، هەتا بتوانم تۆزێك خزمەتت بکەم ٠ برات دیدار» ٠٠٠

کەوتە بیرکردنەوەی ئوتێلەکە ٠٠٠ ئوتێلی کاسب دەبێت چۆن ئوتێلێك بێت٠٠٠ئوتێل بێتو لە پایتەخت بێت خوادەزانیت کە چەند خۆشبێت ٠٠٠٠ لەوانەیە سیسەمەکانی خەوتنیشی بە کۆمپیوتەر ئیش بکەن و ئاودەستەکانیشیان بە زەخرەفەی جوان نەخشێندرابن و سەمفۆنیای بتهۆفن و سیزاریان تیا لێبدرێت! بەڵام کاسب بۆ ؟ دیارە مەبەستی تایبەتی خۆشیان لەم ناوەهەیەو هەر بۆیە بەمە ناویان ناوە ٠

زۆری بیر کردەوە ، لەئەنجامدا بڕیاری ئەوەیدا کەسەردانێکی هاوڕێکەی بکاتو نوسینێکیشی لەگەڵ خۆی بۆ بڵاوکردنەوە ببات ٠

هەرچۆنێك بێت ئەمڕۆژەیانی بەڕێکردو بەیانی زوو جانتا بچکۆلانەکەی خستەدەستیەوەو بەرەو گەراج کەوتەڕێ ٠٠٠٠

شوفێری پاسێك بۆ تەنیا نەفەرێك چاوەڕێبوو ٠٠٠خۆی گەیاندێو سەرکەوت ٠٠٠٠

پاسەکە کەوتە جوڵە ٠٠٠ هەولێر لەبەرچاو وون بوو٠٠٠ بەغا ڕێگاکەی دوورە ، بۆیە وای بەباش زانی چێشتەخەوێکی بۆ بکات ٠ قەپەنگی چاوەکانی هێنا خوارو کەوتە باڵەفڕەی مەداری خەیاڵە تەونەجاڵجاڵۆکیەکەی و نەرەقووپی لێکرد هەتا گەیشتە جێ ٠

لەپاسەکە دابەزی ••• بەغا هەرناوەکەی بەخۆیەوەیە•••
تا چاو بردەکات بازاری رازاوەو خانوبەرەی بالایە •••
تاکسیەکی راگرتو داوای کەیاندنە ئوتێلی کاسبی لێکرد••
هیلی کاتژمێرەکەی دەستی چارەکە چەرخەیەك سورایەوە ••••
دووای ئیستاپگرتنێکی کتوپر کاکی شوفێر پێی گوت : ــ
ــ ئەوە ئوتێلی کاسبە ، فەرموو دابەزە •
دوو دەرگای گەورەوەك دەرگای خانەکەی کوێخامەند••
گۆرەپانێکی پانو بەرینیشی لەناو زگیدا ، کۆنە تەنەکەو
بالیفو دۆشەکی شرو ور ، وەکو دیمەنی دەلالخانەی «هەولێر»
یان دەهێنا بەرچاو •
یەکەم هەنگاوی بەرەو ژوورنا ••• کورسیو مێزێکی
ژەنگاوی ••• پیاوێکی چاوکزی قەمبوور باوەشی پێدا کردبوو،
«راپێدەچوو باشکاتبی ئوتێلەکە بێت • بەبێ پرسە چووە
ژوور سەریو پێی گوت :
ــ ئەمەیە ئوتێلی کاسب ؟
ــ بەڵێ •
ــ هیچ ئوتێلی تر بەم ناوە هەیە ؟
ــ نەخێر ، لەئێمە زیاتر کەس مافی بەسەر ئەم ناوە نیە ،
هەر بۆیە یەکەم ئوتێلە لە پایتەخت ئەم ناوەی هەلگرتبێت •
ــ دەمەوێ لێرە دابەزم •
ــ دووانزە پەنجایی دابنێ •••• جێگاکەت لەم سالۆنەیە•
ــ کامَ سالۆن ؟
ــ ئەم کۆرەپانەی دەیبینی هەمووی هەرهەوە ، کامجێت
بەدڵبوو لێی بخەوە •

ـ من هاورێی دیدارم

کە ئەمەی گوت لەبەری هەڵستا ، بەرێزلێنانەوە داوای لێبوردنی لێ کرد ... دەفتەرێکی دڕاوی لەژێر تەختەشڕەکەی بەردەمی دەرهێناو بەقەڵەمپاندانە نووك شکاویەکەی ناوی لەژووری ژمارە دوو تۆمارکرد و پێی گوت :

ـ چونکە هاورێی دیداری لەگەڵ ئەولەیەك ژووردادەنێم .

ژووری ژمارە دوو لە نهۆمی سەرەوە بوو .... کەوتبووە لای ئاودەستخانەو دەستشۆرێکەوە ....

هەر لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکە سێ مشك بەجارێك خۆیان هەڵکوتایە دەرەوە .

ـ ئەمەچیە ؟ ! بۆ نایانکوژن ؟

ـ تەڵەشمان بۆداناون بەڵام بەلایانەوە ناچن .... جێگای تەفەرمان لێناگرن ئەگینا چارەمان دەکردن ....

وای بەباشزانی ئەورۆژەیان نەچێتەدەرەوە .... دەرگای داخست .... لەسەر گازی پشت لێی ڕاکشا ، دەی ڕووانیە هەر چوار گۆشەکانی ژوورەکە ....

ژوورێکی بچووك ... دیوارەکانی لەهەموولایەك قڵیشی گەورەیان دابوو ، شوێنەواری ئاوی بارانیش بەدامێنی بۆیاخ و بنمیچەکەوە دیار بوو . جریکەی مشکان و جیڕەی تەختەی نوستنەکەشی تێکەڵ بەیەك ببون ....

چاو بڕیە ژێر تەختەکە ... کۆمەڵێك جل و بەرگی هاوینی و چەند جووت پێڵاوێکی بینی . کەوتە بیرکردنەوە : «ئەی جانتاکەی کوانێ .... هەڵبەت ئەم پیاوە دەستخەڵەتی داوم ... ئەمە لەجێگای دیدار ناچێت ... ئەمە سەکتەخانەیە و هێلانەی

مشکانه ، خۆ جێگای مرۆڤ نیه…» ٠

لەگەرمەی خەیاڵو بیرکردنەوەیدا بوو ، لـەپڕ دەرگـاکـە کەوتە سەرپشت و دیدار بەژوور کەت ٠٠٠٠ باوەشیان.بەیەکدا کردو تێروپڕ ڕووی یەکتریان بەماچ ڕازاندەوە ٠

بەدووقۆڵی دانیشتن ٠٠٠ سەرگوزشتەی چەندساڵەیان لەو شەوە درێژەی چلەی زستانـەدا شـەنەیاکـرد ٠٠٠٠ میـلی کاتژمێرەکەی دەستیان وەکو فرفرۆکـەی منالان دەسوڕایـەوە و ژمارەکانیش چاوشارکێیان لەگەڵ چاویان دەکـرد ٠٠٠ زۆری نەمابوو ڕۆژ هەڵبێتەوە ٠٠٠٠ گلێنەی چاوەکانیان وەکو ئـاوی شێلـوی بەستەکـانی باداواو کـەسنەزانیـان لێهـاتو نـەرمە باوەشکیان دەهاتێ هەتا لەپەلوپۆ کەوتن وتواناى ئۆقرەگرتنیان نەما و دارژانە سەر تەختەشرەکە و مشکەکانیش کەوتنـە پشـت شیلانو کۆلنج شکاندنەوەیان تاکو بەیانی ٠

بەیانی لەخەو هەڵستا ٠ دیداری نەبینی ٠ لەبەرخۆیدا گوتی : «بەم زەردەپەڕی بەیانیە بۆ کوێ ڕۆیشتوە ؟ نەکاتی نانخواردنە و نە دەوامی دائرە !! »

ئەو لەوبیرانەدا بوو ، لەپڕ لەقەیەکیان لەدەرگاداو دووبرین پێچ بەخۆیان و هەڵگرەوە بەژوور کەوتن ٠٠٠ چوارپەلیان گـرت و خستیانە سەری و بەرەوخوار بەڕێیان کرد ٠٠ هەرچەندی گوتی چیە ٠٠٠ بۆ کوێ ئەمبەن ٠٠٠ بەلام هیچ وەلامیان نەدایەوە٠٠ دەنگەدەنگو غەڵبەغەڵبی خەڵکیش ناو نوتێلەکەی تەنیبۆوە٠٠٠ ئیسعافێکی سپی لەبەردەرگا وەستابوو ٠٠٠خستیانە پشتەوەی ، لەدیمەنی پاسەکەی حاجی عوبیدی دەکرد ٠٠٠ چەند نـەفـەری نوتێلەکە هەبوون هەموویان لەناو ئەو ئیسعافەدا کۆکرابونەوە،

گەیشتنە نەخۆشخانە٠٠٠٠دوای پشکنینێکی وورد گوتیان:

ـ باش بوو لێت بەدوور بوو ٠

بەبێ ئەوەی هیچێکیان بزانن مەسەلەچیە ٠

ـ بۆچی بووە ؟

ـ پانزەکەس لە نەفەرەکانی ئەم ئوتێلە دوێنێ شەو بە نەخۆشی تاعون مردوونە ٠٠٠ گومانمان لە ئێوەش بوو بەڵام لە ئێوە بەدوور بوو ٠

دووبارە گەڕایەوە ئوتێل ٠٠٠ دەرگا داخرابوو٠٠٠ بەزنجیر و قفلێك کلیل درابوو ٠٠٠ چەند مۆرێکی وەزارەتی تەندروستیشی بەدامێن دەرگاکەوە بوو٠٠٠گریان لەقوڕگی داما ٠٠٠فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس ما٠٠٠وای هاتەبیر دیداریش بەبەر مردووەکان کەوتبێت ٠

گلۆڵەی شەقامی ڕەشیدی گرتەبەرو بەنائومێدی و دڵساردی هەنگاو هەنگاوی دەپێوا ٠٠٠٠ لەکۆڵانێکی تەنکەبەری نزیك ئوتێلەکە خەڵکێکی زۆری بەدی کرد بەسەریەکدا ڕژابوون٠٠٠ مەزاتی کەلوپەلیان دەکرد ٠٠٠ وای بەباش‌زانی خۆی بگەیەنێتە ناویان‌و چەند کاتژمێرێك بەسەربەرێت ٠ نزیك کەوتەوە٠٠٠ هەر لەدووردا دیداری لەسەر بەرمیلێك بەدی کرد ، جووتە پێڵاوێکی بەدەست بەرزکردبۆوە و دەیگوت

ـ مەزات ٠٠٠ دووانرخ یەك دینار ٠٠٠٠

چاوەکانی هەڵگلۆفت ٠٠٠٠ باوەڕی نەدەکرد دیداربێت٠٠٠٠ بەڵام کە لێی نزیك کەوتەوە دڵنیابوو ٠٠٠ حەپەسا ٠٠٠

ـ دیدار ئەوە تۆی ؟ !

ـ بەڵێ ئارام بگرە ، ئێستا دێمە خوارەوە ٠

ـ مەزات ···مەزات ··· هەرزانمان کرد ··· قازانجمان لێی ناوێ ·· بەلاش ··· نیودینار ····

ـ من دەمەوێ ·

ـ شافل خێر ·

بەمجۆرە هاتەخوارەوە···دەستی گرت بەرەو چێشتخانەی مەیدان کەوتەڕێ ·

بەسەر سوڕمانەوە پێی گوت :

ـ دیدار تۆ لێرە ڕۆژنامەنووسی یان کۆنەفرۆشی ؟!

ـ ڕۆژنامەنووسو کۆنەفرۆشم ··· لـەکـاتی بێپارەیی و قاتیو قووتیدا ئەوەی هەمانە هەڕاجی دەکەینو پێی دەژین کـە گەیشتینە مووچەی سەریمانگ دووبارە دەیانکڕینەوە ····

ئێستا ئەگەر ئەم کۆنەجلانەو جووتە قۆندرەیە نەبـوایـە خوا ئاگادارە خاوەنی فلسێکی سوور نەدەبووم !

قسەکانی پێ بڕی ···

ـ نازانی چیبووە ؟!

ـ چـی ! !

وردو درشت بەسەرهاتی ئوتێلەکەی بۆ گێڕایەوە ، دووایی پێی گوت :

ـ ئەی لەمەودووا لەکوێ دەخەوێت ؟

بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی :

ـ زۆر جاری تریش ئەمە ڕویداوە و لەمانەش زیاتری تیـا مردوونو وەکو ئێستا بەڕێوەبەرێتی تەنـدروستی دایخستووە و دوای ماوەیەکی دیاریکراویش کراوەتەوە ··· ئاسـانە ئـەم چەند ڕۆژە هەر لەدائیرە دەخەومو خەفارەتی فەرمانبەرەکـانیش

وەردەگرم ٠

ـ هەر بەمجۆرەش دڵتان خۆشەو گوایا لە پایتەخت دەژین؟!

ـ دەوەڵلا سێ بەشی دانیشتوانی ئێرە ئەمەحالیانەو پایتەخت کۆشكو تەلارو ئوتێلی شیراتۆنی بۆچەند کەسانێکی کەمە ٠

میلی کاتژمێرەکە گەیشتە سەر حەوتونیو ٠٠ ڕوی تێ‌کردو گــوتی : ـ

ـ کاتی چــونەدائیرەم هاتــووە ، لــەگــەڵم بفەرمــوو تــا بەبرادەرانت بناسێنمو ئەونوسینەی هێناویشتە بڵاوی بکەینەوە٠ بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی :

ـ زۆر سوپاس ، ئەوە ئەونوسراوەیە کە هێناومە ٠

دوای ئەوەی ماڵئاواییان لــەیەکتر کــرد ئــەمیان بــەرەو دائیرەکەی خۆی هەنگاوی نا وە ئەوی تریش بەرەو گەراج بەڕێ کــەوت ٠

**١٩٨٣**

**تێبینی : ـ**

**بیرۆکەی ئەم چیرۆکەم لە ساڵی ١٩٧٦ نوسیوەتەوە ٠**

هەموو ڕۆژێك بەیانی زوو تۆڕەکەیان دەخستە سەرشانو
بەرەو کەناری ڕووبارەکە دەکەوتنەڕێ

نیوەڕۆ بوو ... ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان بوو... لەژێر
سێبەری شەنگەبیەکە دانیشتبون ، تلشە بەردێکیان کردبووە
نیشانو بەردیان تێ ی دەگرت .... حەمەلاویش چاوی بڕیبووە
تۆڕەکەی خۆی ... لە خەیاڵی ماسی گەورەدا بوو .. ئەو
ڕۆژەیان لە نوێ تۆڕەکەی لەمشوێنەدا خستبووە ئاوەوە ، بۆیە
هیوایەکی زۆری پێ هەبوو .

هەرلەکۆنەوە ئەوجێگایە بەکونە ماسی ناوبانگی دەرکردبوو ،
گوایا مۆڵگای ماسیە گەورەکانە .

ناوەناوە تۆڕەکە دەلەریەوە ... زەردەخەنەیەك هاتە
سەرلێوەکانی و لەبەرخۆیدا گوتی :

ـ ئەمەیەك ... دووان ... سێ... چوار ماسی گەورە !
دیارە گەورەن ، دەنا چۆن تۆڕەکەیان پێ دەلەرێتەوە ...

ئەمجارەیان مسۆگەرە ، تۆڕی وا بە ماسی بچوك نالەرێتەوە•••
•••بێگومان ماسی گەورەنو بەبەر لێشاوی ئەمجارە کەوتوون خواردنی ماسی گەورەش خۆشە ••••دەڵێن ھەیوا لەسەر تاشەبەردی داخکراوی ناو ئاگر سووردەکرێنەوە و زۆر بەلەزەت دەبێت •

لەناو بیرگردنەوەو خەیالی قوڵی ماسی گرتندا خنکابوو•• هیچ ئاگای لە کورگەلی ئاواییەکە نەمابوو ••• لەناکاو تەقەیەك هاتو ئاورەحمان پڕ بەدەنگ هاواری کرد :

ـ لێمدا••• خستمە خوارەوە ••• ئەوجا نیشانچیەکی بێھاوتام •

ـ ئەی دەستەکانت خۆش ، هەر لە خۆت دەوەشێتەوە •

زنجیرەی بیرکردنەوەی پچڕا ••• ڕاچڵەکی هەروەکو ئەویش لە نیشانێکی دابێت ، وا خۆی هاتەبەرچاو •••

سەری هەڵبڕی ••• ڕۆژ بەرەو ئاوابوون لار ببۆوە ••• تەنانەت سێبەری شەنگەبیەکەش کۆچی کردبوو و بەرەو ئاوەکە هەڵکشابوو ••• ئاوڕی لە هاوڕێکانی دایەوە و گووتی :

کوڕینە با تۆڕەکانمان دەربێنین ، ماسیەکی زۆریان گرتووە • پەلەمان نیە، با ئەمشەویش هەر لەناویدا بمێنێتەوە هەتا زۆرتری پێوەبێت • شەوانی درەنگ ماسیەگەورەکان دەخزێنە نـاو لێوارەکانو بەتۆڕەکانەوە دەبن •

ئەو گوێی نەدانێ ••• خۆی ڕووتکردەوە و چوورەسەرپشتی چوپەکەی و بە باسکەمەلە بەرەو تۆڕەکەی ڕۆیشت •••••••
دەستی کرد بە کۆکردنەوەی تۆڕەکەی •••• لەسەرەتادا هیچی پێوەنەبینی بۆیە گوتی :

بێ‌گومان ماسی گەورە لەکۆتایی تۆڕەکەدا پێوەدەبێت ٠
زیاتری کۆکردەوە تاکو گەیشتە کۆتایی تۆڕەکە ٠٠٠
نەهەنگە قرژاڵێکی چاوتەلیسماوی پێوەنووسابوو ٠

هەناسەیەکی ساری هەڵمژی‌و دووبارە کەوتەوە گیان
داناوەی تۆڕەکەو لەبەرخۆیدا گوتی : «نۆشی‌گیانم بێت٠٠٠زۆر
پەلەم کرد بۆیە نێچیری ئەمڕۆم لەجیاتی ماسی گەورە ئەوقرژاڵە
چاو بەلەبوو ٠٠٠٠بەڵام باوابێت ، ئەمجارە بەیانیش تۆڕەکەم
دەرناهێنم هەتا کۆمەڵێك ماسی پێوەدەبێت ٠٠٠ مەرجە ئەو
قرژاڵەش لێنەکەمەوە چونکە دەستخەڵەتی دام ٠

– ١٩٨٠ –



ـ ١ ـ

تاریکەشەوێکی ئەنگوستەچاوبوو ٠٠٠ هەر لەئێوارەوە ببووە ئێشکگری بەیتونەکەیان و چاوی بڕیبووە ماڵەکەی بەرامبەریان ٠٠٠ بڕیاری دابوو لە کاتژمێری دووی شەو بەیەك بگەن ٠٠٠ زەنگی کاتژمێری دیوەخانەکەیان کەوتەلێدان ٠٠٠٠ دووی تەواوی نواند ٠ ویستی بەئەسپایی بچێتە خوارەوە ، بەڵام لەناوەڕاستی پێپلکەکە قاچەکانی تێك ئاڵانو لە قوتوی شەکرەکەدا و بەری داوە ٠٠٠٠ باوکی خۆی جوڵاندەوەو دووجار کۆکی ٠٠٠٠ هەندێك ڕاوەستاو دووایی بە ئەسپایی خۆی گەیاندە خوارێو چووە دەرەوە ٠

ـ ٢ ـ

نەسرین لەبەردەرگای ماڵیان چاوەڕێی دەکرد ٠٠٠ دەستی یەکیان گرت ، بە ئەسپایی کەوتنەڕێ ٠٠٠٠ سەری خستە ژێر گوێی و پێی گوت :

ـ دەچینەوە کەلاوەکەی دوێنێ شەو ٠٠٠٠
ـ زۆر باشــە ٠
ـ ئەمشەوەیان لە دوێنێ شەو خۆشترە ٠
ـ بـۆ ؟
ـ دوێنێ شەو یەکەم جارمان بوو ، بۆیە زۆر دەترسام کـــە لێمان ئاشکرابێت ، بەڵام ئەمجارەیان ترسم شکاوەو بەئارەزوی خۆمان دەدوێین ٠
ـ ڕاستدەکەی ٠٠٠ منیش دوێنێ هەتا گەڕامەوەش هەردڵم لەناو دەستم بوو ٠
گەیشتنە کەلاوەکە ٠٠٠٠ چوونە ژوورەوە
چوونە ئامێزی یەکتر ٠٠٠ بەنەسرینی گوت :
ـ ئەمشەوەیان چیم بۆ دەکەیتە دیاری ؟
ـ چەند ووشەیەکی خۆش ٠
ـ چی تریش ؟
ـ زەردەخەنەیەك ٠
ـ چـــیتــر ؟
ـ ماچێــك
ـ هەرزوو ئەمەت گوتباو بڕایەوە
باوەشی پێداکردو دەمی لەلێوەکانی نزیك کردەوە ، ویستی ماچی بکات ، تەپەی شتێك هات ٠٠٠٠
هەستیان ڕاگرت ٠٠٠ تەپەتەپەکە نزیکتر بۆوە ٠٠٠ دڵیان ڕاچڵــەکی ٠٠٠٠ نەسرین زیاتر خــۆی خزانــدە باوەشیو ترس لێی غافڵبوو ، بەئەسپایی پێی گوت :
ـ چیم لێدەکەی ٠٠٠ بێگومان ئەمە باوکمە و بەدووامانda

هاتــووه ٠٠٠٠

ـ چۆن دەزانیت ؟

ـ كه لەسەربان هاتمه خوارەوه ، گوێم لەدەنگی كۆخەی بوو

ـ كێ دەڵێت باوكته ؟

ـ دڵم وادەڵێت٠٠٠٠زۆر شەو وابووه، له ئێستاش درەنگتر باوكم هەڵساوەو دایكمی به ئاگاهێناوه بۆ چۆڕێ ئـاو یان بـۆ پاكەته جگارەكەی ٠٠

ـ ئەگەر باوكی تۆنەبێت ، هەڵبەت هیمنه ٠ باوكـی منیش هەندێك خۆی هێناوبرد ، لەوه دەچوو بەئاگا بێت ٠٠٠٠٠

زیاتر ترسیان لێ‌نیشت ٠٠٠٠ هەموو لەشیان كـەوتبووه لەرزه ٠٠٠ تەپەتەپەكـه تادەهات نزیـك دەكـەوتـەوه ٠٠٠٠ گەیشته ناو حەوشەی كەلاوەكه ٠٠٠٠

خۆیان لكاندەیەك ٠ ڕوی‌كردە نەسرین‌و پێ‌ی گوت : ـ

ـ خوا دەزانێ هەرئێستا دەمانكوژێت‌و ئابڕوی‌هەزارساڵمان دەچێت ٠٠٠٠ باشه چی‌بكەین ؟

چوزانم ، مەگەر خۆمان بخەینه سەر قاچەكانی‌و داوای لێ‌بوردنی لـێ‌بكەین ٠

ـ قسەكەت زۆر جوانه ٠ لەوەزیاتر هیچ دەستەڵاتمان نیه٠

لەم قسانه بوون ٠٠٠٠ تەپەتەپەكه هەنگاوی بەرەولایان هێنا ٠٠٠ هات ٠٠٠هات ٠٠گـەیشته پشتەوەیان ٠ لـەترسـان خۆیان لەگەڵ دیواری كەلاوەكه جووت كردبـوو ٠٠٠٠ تەقـەی شتێك هات‌و تەپەكه دەنگی بڕایەوه٠ نەسرین خۆی پێ‌نەگیرا٠٠ پڕبەدەنگ هاواری كرد :

ـ بابەگیان چیم لێ‌دەكەی بیكه ٠٠٠ گیانم لەژێردەستتدایه

ـ بابەگیان بمکوژە دەستەکانت خۆش بێت ٠٠٠٠سوچی خۆم بوو بۆیە دووچاری ئەو شەوەزەنگە بووم ٠٠٠٠

قسەکانی تەواونەکردبوو ، زەڕەزەڕی گوێدرێــژێك لــە پشتیان بەرزبۆوە ٠ کە عەلەتریکە بچکۆلانەکەی پێکرد ، ســەرو کەلەی گوێدرێژێك لەپشتەوە بەدەرکەوت ٠

**١٩٨٢**

**تێبینی**

**بیرۆکەی ئەم چیرۆکەم لەساڵی ١٩٧٨ نوسیوە**

تازه لەسەر سفرەی نانخواردنەکە دانیشتبوون ••• زەنگ لێدرا ویستی خۆی لێ گێل بکاتو بەردەوام بێت لە نانخواردنیدا ••• ئەمجارەیان زەنگێکی درێژتر لێدرا و نەبڕایەوە ••• واپێدەچوو شتێك ڕوویدابێ ، ئەگینا بۆ ؟ ••• هەڵسایە سەرپێ و دەرگاکەی کردەوە ••• بەبێچاکیو چۆنی بەژوورکـەوتو بە توندیـەوە گـــوتی :

ـ زووکە خۆت ئامادەبکە ، بابڕۆین !

ـ بــۆ کــوێ ؟

ـ بۆ نەخۆشخانە •

ـ بۆ ، خێرە ؟ خوانەخواستە هیچ ڕویداوە ؟

ـ ناکا نەتزانیبێت !

ـ بۆ چی ڕوویداوە ؟ !

ـ باوکت لە نەخۆشخانە خەوتووە •

ـ بۆ باوکم چیەتی ••• ئەی بۆ نەمزانیوە ؟!

ـ دەڵێن پاڵەپەستۆی خوێنی هەڵساوە و تەندروستی لــــە مەترسیدایە ٠

بەپەلە خۆی گۆڕی ٠٠٠زۆر دوودڵیش بوو کە لەگەڵیدا بچێت٠ سواری قەمارەکە بوون و بەرەو نەخۆشخانە کەوتنە ڕێ ٠

ـ ٢ ـ

ڕەنگی دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو ٠٠٠ دڵی کــەوتبووە خرپە ٠٠٠ بیری ئەوەی دەکردەوە «کــە نویکەی ساڵێکــە قسەی لەگەڵ باوکیدا نیە و بچێتەلاشی لەوانەیە هەر لەدورەوە چەنگــە تفێکی بۆ ڕەوان بکات و لەپێش چاوی نەخۆشەکانی قاوشــەکــە چاوی بشکێنێ و ئابڕوی ببات ٠٠٠ » باوکی زۆر توندو تیژبوو لەگەڵیدا ٠٠٠ هەر لەمناڵیەوە هەتاکــو ئــەو ڕۆژەی ژنی هێنــا نانێکی بەبێ شەقی نەخواردبوو ٠٠٠ هەمووجارێــك لــەســەر تەنیا قسەیەکی کەم هەڵی دەکوتا ســەری و دارکاریــەکی باشــی دەکرد ، یان بە بیانوی قسەیەکی بچوك دەری دەکــردە دەرەوەو تفی بەڕویدا دەکرد ٠٠٠٠ ئەمەلەلایەك و لەلایەکی تریش ئــەم نهێنیــەی لــەلای هیــچ لــە هاوڕێکــانی نەدرکاندبــوو ، زۆر شەرمی لــەوەدەکرد ، ئەگەر بێت و لــەکت و پڕیدا هــەڵبکوتێتــە سەری و جوێنی پێبدات ٠٠٠٠ بۆیە بڕیاریدا کــە ئــەم نهێنیە بدرکێنێت و پێی بڵێ ٠

ـ ٣ ـ

گەیشتینە بەردەرگای نەخۆشخانە ٠٠٠ خۆی خستە دوواوە ٠٠٠هاوڕێکەی قۆڵی گرت و پێی گوت :

ـ فەرموو پێش‌کەوە ٠

ـ تۆ بڕۆ من لێرە دەبم ٠

- چۆن !!ناتەوێ باوکت ببینی ؟
- دەمەوێ بیبینم ، بەڵام ····
- بەڵام چی ؟
- بەڵام من ماوەیەکە قسەم لەگەڵیدانیە ····
- چۆن ! ئەوەبەڕاستی دەڵێی ؟
- بەڵێ ، باوکم زۆر دڵڕەقو بێووژدانە ، هەمووجارێك بە چەکوش هەڵیدەکوتا سەرمانو دارکاری دەکردین بـۆیـە ئـەوە ماوەی ساڵێك دەبێت قسەم لەگەڵدا ناکات و نەفرەی لێ کردووم · ···ئێستاش لەخۆم ڕانابینم بچمە ژوورسەری ···· لەوانەیە دارکاریم بکاتو ئابڕوم بەرێت لەبەرچاوی نەخۆشەکان ·
- نابێت · با دوو شەقیشت لێ بداتو دوو قسەشت پێ بڵێ، خۆ هیچ لە نرخت کەم نابێتەوە ·

بڕیاریدا کە بچێتە ژوورەوەو دەستەکانی ماچ بکاتو داوای لێبووردنی لێ بکات

چوونە ژوورەوە ، هەر لەبەر دەرکا پرسییان :

- نەخۆشێکمان هەیە ناوی ئەسعەدە ، ئایا لێرەیە ؟
- بەڵێ ، ئەو قەرەباڵغیەی دەیبینی خۆیەتی و تەندروستی زۆر خراپە ·

کەئەمەی گوێ لێ بوو، فرمێسك لە چاوەکانیدا قەتیس ما·· ··بەزەیی بەحاڵی باوکی هاتەوە···· پەڕاکردن چوونە ژوور سەری ··· باوکی ئەو نەبوو···ئامۆزای هاوڕێکەی بوو ··· ئەمیش ناوی ئەسعەد بوو ··· سەری سوڕما···ڕووی تێ کردو بەسەرسامیەوە پێی گوت :

- ئەی بۆ گوتت باوکتە ؟

ـ گوتیان ئەسعەد لە نەخۆشخانەیە ، منیش لێیانم دووبارە نەکردەوەو گومانم لە باوکت بوو • چونکە باوکت پاڵەپەستۆی خوێنی هەردەم هەبوو بۆیە پێم گوتن •

ئەوجا بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی :

ـ ئێ•••ئێ•••بڵێ تۆش نەتزانیبوو ئەسعەدی ئامۆزاتەو باوکی من نیە ؟ ڕووی کردە ئەسعەدو پێی گوت :

ـ هیچ ئیشت نیە ، ئێستا دەچمەبازاڕو هەواڵ بۆ براو خێزانەکەت دەنێرم• خێری پێوەبوو ، ئێمە بۆکێ هاتینو کێمان دۆزیەوە •

ـ ١٩٨٢ ـ



هەر لەورۆژەی چاوەکانم هەڵهێنابوو و تامو چێژی ژیــان تێکەڵ بە دەروونم ببو ، دایكو باوکم ناکۆکیان بوو •

بۆڵەبۆڵو پندەپندی باوکمو ناڵەناڵو ســەرئێشەو دڵئێشی دایکیشم وایان لەئێمەی منداڵان کردبوو کەنەزانین زەردەخەنەو خەندەی سەرلێوان مانای چیە ، لــەگریــەو بێدەنگیو دامــانو خەمناکی زیاتر •

ساڵی دووجار چاوەڕوانی جەژنمان دەکرد تیایدا لــە واتای خۆشی بگەین ، کەچی ئەم دووجارەشیان هەرهیچ نەبایە لەســەر ڕازاندنەوەی ئێمە لەتاریك و ڕۆنی ڕۆژی یەکــەمی جــەژنــدا دەبووە ناکۆکیان و هەریەکەی ڕوویان بۆلایەك وەردەچەرخاندو ئێمەش وەکو منداڵە هەتیو بەبێ ناز دەماینەوە و ئاگامان لەجەژن نەدەماو چاومان دەبڕیە ڕوی گرژو تاڵی باوکمان و کزوماتــیو خەمکینی دایکمان ••••

خۆ هەرکاتێکیش دەمەقاڵیان ببایە ، لەهەفتەیەك کــەمتری نەدەخایەند بۆ چاك بوونەوەیان•••• ئەمەشیان قەیناکات بەڵام چاكبونەوەشیان لەڕۆژێكو دووانی زیاتر نەدەکرد •

بەمجۆرە ساڵدەهاتو دەڕۆیشت بچوكبوینو هەتا گەورەشبوین

نەمانزانی ماڵی بەبێ خەم چیە ! وای لێهاتبو خەم ببوە جەمێکی سەرەکیمان و هەرئەوەندەبوو ناومان (خەمە) نەبوو ·

هەتا بچوك بووم هیچ لێم نەدەگیرا ···· خۆ ئەگەر خۆشم بخستایە سەرباوەشی دایکم و لایم بگرتایە ، باوکم هیچی پێ نەدەگوتم ، تەنیا چوارپەلی دەگرتم و فڕەی دەدامە سەرسوچێکی دۆشەکەکەو دەکەوتەوە گیانی دایکم و دارکاری دەکرد···· جاروباریش کە دەیزانی ئەوی بەدەستەوە نەماوە ، دەکەوتە لاواندنەوەی ئێمەو نازی دەکێشاین ·

کە گەورەبووم ئەو ڕۆژگارانە بەسەرچوون و منیش کەوتمە ناو هەمان لیستەی دایکم و گیانی بەزەیی پێم نەدەهاتەوەو بۆ تەنیا قسەیەك و ناوبڕی کردنێك دەبایە دەربکرێمە دەرەوە و ئاوارەی ئەو دەشتانەبم ·

وەرزی هاوین بوو ··· تازە تاك و توك خەڵکی بەسەر بانەکانیان دەکەوتن····لە بازاڕ گەڕامەوە····یەکەم هەنگاوم نایە ژوورەوە···هەتا هێز لە ئەژنۆی دابوو پێلەقەیەکی لێدام! ویستم ئاوڕبدەمەوە و بزانم کێیە ، ئەمجارەشیان بەدەستە قورسەکەی بۆکسێکی چەقاندە سەر لاڕوومەتێکم و وەك نامەی پۆستەخانە مۆرێکی موستەحەقی بەسەرەوە چەسپاند ····

ماوەی نەدام هیچ بڵێم···دەرگاکەی لەسەرڕووم داخست· کەوتمە بیرکردنەوە :

« بەم شەوە بچم بۆ کوێ ؟ ئەگەر ڕووبکەمە ماڵی خزم و ناسیار هەر زوو دەمهێننەوە و دەستدەکەن بەقسەی قەڵەو ··· باوکی خۆتە ····سەری گەورەیە ···سەری بچوك هەرمل

کەچەو زۆر شتی تریش ···! نەخێر ناچمە لایان » ·

ماڵمان دوورە ئاواییبوو ··· لەلای سەریەوە لەدەغڵودان زیاتر هیچی تری لێ نەبوو···وام بەباشزانی ڕووی تێ بکەم· ڕۆیشتمو بەدەم هەنگاونانیشەوە ووردە ووردە خەمەشیعرم بـۆ حاڵی خۆم دەچنی ··· خۆشم هـەر مەیلی وێنەکێشـانو شیعرم هەبوو ····لەشـەوی وەهاشدا ئەوەی شاعیریش نەبێت دەبێتە شاعیرو هەستی دەبزوێت ····

هەتا ماڵمان لەڕۆشنایی چاوبزربوو هـەر ڕۆیشتم ئەوسـا هەندێك چاوم بەدەور و بەرمدا گێڕا ، لـەخاكو ئاسمان زیاتـر هیچی ترم بەدی نەکرد ·

لەسەرەتا نەمدەزانی چی بکەم ، بەڵام هیچ چارم نەبوو ، بۆیە خۆم دابەزەویداو چاوەکانم بڕینە ئاسمان ·

ئاسمانێکی بێسەروژێر ···· شـەوێکی سـامنـاك ··· کۆمەڵە ئەستێرەیەك وەکوزنجیرە لکابون بەیەکەوەو لەمەدارێکدا کۆببونەوە····ئەستێرەی کاکێشانیان پێ دەڵێن····هەندێکی تریشیان لەسوچێکی تریئاسمان هەڵبەت ئەمانیش ناوێکی تریان لێنراوە ···· یەکێکی تریشیان بە خێرایی بەمابەینی زۆربەی ئەستێرەکـانـدا تێدەپـەڕی ئـەمیشیان «عـەشتار »ە جـابـۆ ئاوارە نەبێت ؟

ئاوارەیە بەڵام ئێمە (مەمانان) ناومان گۆڕیـوەو ئاگـامان لەحاڵی نیە ···· ئەگینا کێ بەم بەشەی ڕازیە کـە لانـەیەکی نەبێت ! لەم بیرکردنانەدا بووم لەپڕ لوورەی کەمتیارو حـەپـە حەپی سەگان هاتنەگوێم ، خۆم وەرچەرخاند و هەستم ڕاگرت·· تادەهات زیاتر دەنگەکان نزیك دەبونەوە ···

«دیاره هەرمن ئاوارەی ئەم دەشتانە نەبوومە ··· هاورێم زۆرن ! » هەرچەندە زۆریشم خەودەهات . بەڵام ترس خۆی لێم مەڵاس دابوو و ماوەی نەدام پێڵوەکانم بخەمەسەریەك ···· شەوێکی سەختو ناهەموار بوو····تادەهات شەویش لەبەر چاوم درێژدەبۆوەو کۆتایی نەدەهات ····

« رەنگە بێت لە شەوێکی‌وادا بتوانم قەلایەك لە شیعرو هۆنراوەی ناسك دروست‌بکەم ··· بەڵام چۆن ؟

نە خەو لێ‌دەگەڕێ هەستم دەربڕم وە نەترسیش لێ‌دەگەڕێ چاوەکانم گەرم بکەم ····

بڕیارم دا کە بەسەر لایەنێکیان زاڵ بم ·

خەو زەفەری پێ نابردرێت بەڵام ترس ئاسانترە ، بۆیە بەقینەوە چاوەکانم نووقاند ·

هەندێك چاوەکانم گەرم کرد ···· هەمووشتێکم لەبیر چۆوە ···· هەروام‌دەزانی لەسەر دۆشەکی اسفنج خەوتوومە ، بۆیە خەویشم بە پلاوەوە دیت ····

لەناکاو هەموو ئازگاری لەشم کوترایەوە ، وامزانی کەوتومەتە ناو چاڵێکی پڕ لە درك ···· لەخەو ڕاپەڕیم‌و دەستم بۆلەشم بردەوە ، یەك پارچە مێروو بوو · وەکو زەردەواڵە پێمەوە نووسابوون ·

« ئەمانە چیان لێم دەوێ ؟ بۆ وەرگەڕاونەتە سەر جەستەم·· ··؟ دیارە بەلاشەی بێ‌گیانم تێ‌دەگەن ! دەیانەوێت دابەشم بکەن ··· یان ئەوانیش وەکو من ئاوارەن‌و دەیانەوێت شارە مێرووم لەسەر دروست بکەن · بەڵام نازانن کەمنیش ئاوارەیەکم وەکو ئەوان ئەگینا بەزەییان بەحاڵم دەهاتەوە !

ناچار بووم بکەومە کوشتن و فڕێدانیان · ژمارەیان بەدەر بوو بۆیە هیچ چارەم نەما، خۆم ڕووت کردەوە و جلەکانم لە خۆم دوورخستەوە ···· بەڵام زیاتر لەجاران دەورەیان دام ·

دەستم گیرا و لەخۆم و زەوی وورد بوومەوە بۆ دۆزینەوەی سەرقافڵەو دوواقافڵەی کاروانیان . بینیم شارەکەیان لەژێرمدا شیوابوو ···· ئەوکات هەناسەیەکی ساردم هەڵمژی و گوتم : (حەقیانە من جێی ئەوانم داگیر کردووە و خۆم پێیانەوە شۆڕ کردۆتەوە ··· !

بەم شەوەدرەنگە خەڵکی لەسەر گازی پشت لێی خەوتوون و خەون بەخۆشی و کامەرانی دەبینن و منیش خەریکی خۆدامالینم لە مێروودا ···زۆر بەزەییم بە حاڵی خۆم دەهاتەوە···· هەندێکی تر دوورکەوتمەوە و دووبارە لێی ڕاکشام ···ویستم چاوەکانم بخەمەسەریەك ، ئەمجارەیان بانگی کەلەشێرەکانی گوندی بادااوان دەستیان پێکردوو فەرامۆشیەك گەیشتە دڵم و لە خۆشیان خەوەکەم ڕەویەوەو کەوتمەوە ژماردنەوەی ئەستێرەکان ···· بەرەبەرە تاریکی کز بوو و ئەستێرەکانیش ووردە ووردە لەبەرچاو بزربوون و شینایی ئاسمان بەتەواوی بەدیارکەوت · لەگەڵ هەنگاونانی ئەستێرەکان منیش کەوتمە هەنگاونان بەرەو قوتابخانە · بەڵام چۆن چوونە قوتابخانەیەك ····

بەبێ پەڕتوك و پێنووس و تێنووس !!

زەنگی قوتابخانە لێدرا ···· بیری بیانوێکم بۆ مامۆستا دەکردەوە : ـ

«ئەگەر هەڵیستاندم دەڵێم . لەناو پاسەکە لێم بەجێما ·

ئەویش بڕوادەکات و ئەمڕۆژەی پێ بەسەردەبەم » ٠
مامۆستا هاتەژوورەوەو یەکسەر هاتە ژوور سەرم :
«بەخوا لێم قەوما ! ئەگبەتی منە بۆیە هاتەلای من ! »
ڕووی تێکردمو پێی‌گوتم : ـ
ـ هەڵسە بچۆ یانەی مامۆستایان میهرەجانی شیعریمان هەیە، تۆمان بەناوی ئەم قوتابخانەیە هەڵبژاردووە.؟
هەناسەیەکی شادیم هەڵمژی‌و بزەیەك هاتە سەر لێوەکانم‌و بەوپەڕی بەختەوەریەوە چوومە دەرەوە ٠
میهرەجان دەستی پێکرد ٠ شاعیران شیعریان خوێندەوە هەتا کەییە ناوی من ٠
چوومە سەرشانۆ و شیعرێکم بەناوی ـ (هەر من ئاوارەم) پێشکەش کردو یادگارەکانی ئەو شەوە سەخت‌و سامناکەی تیایدا بە ئاوارەیی ژووانی تاریکی‌و ڕۆنی سەر لە بەیانیم گرت هۆنی بۆوە ٠
لە کۆتاییدا بەسەرکەوتو لە قەڵەم درام‌و خەڵاتی میهرەجانەکەم پێ‌بەخشرا ٠ میهرەجانەکە بە شیعرەکەی من کۆتایی پێهات ٠
هەرلەهاتنەخوارەوەم‌و هەتاکو چوونە دەرەوەشم لە هۆڵەکە بە چەپڵەلێدان‌و پیرۆزبایی بەڕێکرام... بەڵام کە گەیشتمە دەرەوەو هەرکەس بەڕێی خۆیدا ڕۆیشت‌و من بە تەنیایی مامەوەو نەمدەزانی بۆکوێ بڕۆم. ئەوکات هەناسەیەکی ساردم هەڵمژی‌و دەستەکانم خستەسەر چۆکم‌و لێی دانیشتم ٠
١٩٨٣

تێبینی : ـ
بیرۆکەی ئەم چیرۆکەم لەساڵی ١٩٧٧ نوسیوەتەوە ٠

●●●

لەم شارەدا

زیندو نانی

مردووە خوا

ماوەیەکی زۆ بوو ، ناڵەی بوو بەدەست ئێش و ئازاری ددانە کاکیلە کلۆرەکەی٠٠٠٠مام ئۆمەر و کوێخاش زۆر بەسەر شانو باڵی دکتۆرانی شاریان هەڵدا ٠٠٠٠ ناچاریان کرد بچێ بەدەم هەواڵی نەخۆشخانە گەورەکەی شارەوە ٠٠٠٠

چەند دوکانێکی دارتاشی و چایخانەیەکی خنجیلانە درێژ ببونەوە بەسەر شەقامێکدا ٠٠٠٠

منداڵێکی هەرزەکار سەتڵێکی لەسەر شۆستەی شەقامەکە دانابوو ئاوی ساردی دەفرۆشت٠ زۆری تینوو بوو٠٠٠٠وای بەچاك زانی جامێك ئاوی لابخواتەوە ٠ چووە لای و پێی گوت :

ـ بچکۆل جامێك ئاوم بدەرێ ؟

ـ فەرموو ٠

ـ خێرێکی گەورەیە ٠٠٠ خوا قەبوڵی بکات ٠٠٠ بچکۆل گیان بەچی مناسەبەیەکە ؟

ـ بەبێ موناسەبەیە ٠٠٠٠ دەکاتە ٢٥ فلس ٠

ـ بۆ لێرە ئاویش بەپارەیە ؟
ـ خۆ زەکاتیش نیە !
پارەکەی دایەو لێی پرسی :
ـ ئەخۆشخانەی گەورە لە کوێیە ؟
ـ لەسەرەوەی ئەم کۆلانەیە ٠
ـ زۆرچاکە . ڕۆژیش بەبەریەوە ماوە ٠٠٠ ماوەی گەڕانە-
وەشم دەبێت ٠ پێش‌ئەوەی بگاتە ئەخۆشخانە ، چایخانەیەکی
بەدی‌کرد ٠٠٠٠ زۆری برسی بوو ٠٠٠ لای‌دایە ژوورێو لە
سوچێکی دانیشت ٠٠٠ لەبەرامبەری چایخانەکە چەند دوکانێکی
دارتاشی هەبوون ٠٠٠٠ دارجەنازەو سندوقی مردووانیان
دروست کردبوون ٠ بەبینینی ئەم دیمەنە سەری سوڕما ٠٠٠ !
ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕاکێشابوو ، جۆراو جۆری سندوقەکان
بوو ، چونکە هەموو سندوقەکان لەیەك نەبوون٠٠٠٠هەندێکیان
لەتەختەو پارچەداری ئاسایی و سندوقی سێوو پرتەقاڵ دروست
کرابوون وە هەندێکی تریان لە داری ساجو جاوی دروست
کرابوون ٠٠٠٠سەرەڕای ئەوانەش بە زۆر جۆری نیگاری جوان
هەڵکەندرابوون و بە خەتی جوان ئایەتەکانی قورئانیان لەسەر
نووسرابوو ٠٠٠٠

لەبەردەم خۆیدا گوتی : «ئەمانەش قەیناکات٠٠٠بەڵام تۆ
بڵێی هیچیان لەم کارەیاندا دەست کەوێ!! »

لەم بیرکردنەوەیەدا بوو ، کابرای چایەچی هاتە ژوور
سەزیو گوتی :
ـ چی دەخۆی ؟
ـ چایەکم بۆ بێنەو دووایش نەفەرێك کەباب ٠

پێش ئەوەی بڕوات بەهەڵی زانی چەند پرسیارێکی ئاڕاستە بکات ، بۆیە سەری لێ بردەپێش و پێی گوت :

ـ ئەم دارتاشانە چۆن ڕسقیان دەست دەکەوێ ؟

دای لەقاقای پێکەنین‌و هەر نەیبڕاندەوە .... لەگەڵ ئەویش دانیشتوی ژێرو ژووری چایخانەکە دایان لە پرمەی پێکەنین ....

ـ پێکەنینی بۆچیە ؟ هیچ قسەی خراپم کردووە ؟

ـ نەخێر ، تۆ ڕاست دەڵێی ، دیارە شتی وات نەدیتوە ، ئەوانە نانی مردوان دەخۆن !

ئەوجارەیان ئەو پێکەنینی هات .

ـ چۆن وایە ! یان بەگاڵتە وادەڵێی ؟ مرۆڤ کەمرد نانیشی دەبڕێ .

ـ ڕاستە نانی دەبڕێ ....چونکە نانەکەیان دەبێتە بەشی ئەو دارتاشە مل ئەستورانەو سەدانی تر .

ویستی زیاتر پرسیار بکات‌و تێبگات ... بەلاّم پێش ئەوەی دووپاتی بکاتەوە ، یەکێك لە تەنیشتی بوو سەری هێنا ژێر گوێی‌و بە ئەسپایی پێی گوت :

ـ ئەو دوو زەلامە دەبینی ؟

ـ بەڵێ دەیان بینم .

ـ دەبینی چۆن لاڵ‌بوونەو لێت مۆڕ بوونەتەوە ؟

ـ بۆ ، چی خراپم پێیان گوتووە ؟

ـ نەخێر ، بەلاّم نایانەوێ ئەوەندە لەم مەسەلەیە بکۆڵیتەوە

ـ بۆ ئەمانیش دارتاشن ؟

ـ لەدارتاشەکان خراپترن ! ئەزانی چۆن ؟

زیاتر سەری لێ نزیك كردەوەو پێی گوت :

ـ ئەمانە گۆڕ هەڵكەنن ٠٠٠٠گۆڕ بۆ مردووان هەڵدەكەنن‌و بەكەرپوچ و بەردیش هەڵی دەچنن ٠٠٠٠ئەگەر ڕۆژێك یەكێك نەمرێ نانیان دەست‌ناكەوێ ٠٠٠٠ كرێكاران لەگەڵ تاریك‌و ڕۆنی بەیاندا دەچنەمەیدان‌و لەگەڵ زەردەپەڕیش بەجێ‌ی‌دەهێڵن چا كاریان دەست‌كەوێ یان نەكەوێ ٠ بەڵام ئەمانە لەبەیانیەوە هەتا ڕۆژئاوا ، چاویان دەبڕنە دەرگای ئەم نەخۆشخانەیەو دوعای مردنی كەسێك دەكەن ٠٠٠٠ بەتەواوی لە دەرگای نەخۆشخانە نای هێننە دەرەوە بەجووتە دەچنە پێشوازی خاوەنەكەی و دەڵێن : ـ

«گۆڕ هەڵچنتان ناوێ »٠٠

جا براگیان زۆر كەس نانی مردووان دەخوا بەڵام هەرناوی ئەوانە بەدبووە !

لەم قسانەدابوون ، غەڵبەغەڵبێك لەبەر دەرگای نەخۆشخانە پەیدابوو ، لەگەڵ دەنگی ناڵەو گرین‌و شین‌و واوەیلای ژنان ٠ گۆڕهەڵچنەكان زەردەخەنەیەكیان هاتێ‌و چوونە دەرەوە ٠٠٠٠ زۆر سەرسام بوو بەم دیمەنە ٠٠٠ڕوی‌كردە كابرای تەنیشتی‌و پێی گوت : ـ

ـ دیارە نەخۆشخانە زەكات‌و سەرفترە لە نەخۆشەكانی دەردەكات ، بۆیە ئەم هەموو دارتاش‌و كرێكارە مردوو خۆرانەی لەدەوردا كۆبونەتەوەو چاویان بڕیوەتە ڕەحمەتی دكتۆرەكان ٠

تۆبڵێی منیش بۆددان كێشانەكەم بچم‌و نەم خەنە ناو تورەكەیەكی خامی دوودیناریەوە ؟ !

١٩٨٣

●●●

مجموعة قصصية

الضيـاع

| ناومرۆك :ـ | لاپەڕە |
| --- | --- |
| ١ ـ وون بـوون • | ٥ |
| ٢ ـ سیخوڕ • | ١١ |
| ٣ ـ لە چایەخانەی کەوبازاندا • | ١٩ |
| ٤ ـ قاپەقوڕ • | ٢٧ |
| ٥ ـ شەوێك لە ئوتێلی کاسب • | ٣٥ |
| ٦ ـ ڕاوەماسی • | ٤٧ |
| ٧ ـ کـــەلاوە • | ٥٣ |
| ٨ ـ دۆزینـەوە • | ٥٩ |
| ٩ ـ شەوێك لە ژیانمدا • | ٦٥ |
| ١٠ ـ لەم شارەدا زیندوو نانی مردووان دەخوا • | ٧٣ |



بەیارمەتی ئەمینداریتی گشتیی ڕۆشنبیریو
لاوانی ناوچەی کوردستان چاپکراوە

**کارە هونەریەکان :**

★ بەکامیرا یەهونەرمەند اسماعیل هەمەوەندی خاوەنی ستۆدیۆ **ڕزان وێنەی شێتەکان** گیراوە ·

★ بەپێنووسی خۆشنووس احمد عبدالرحمن نووسینی بەرگ‌و ناوی **چیرۆکەکان** نووسراوەتەوە ·

★ دیمەنی بەرگ لەلایەن خــۆم ·

ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی نیشتمانی : (١٢٦٦) ١٩٨٤

چاپخانەی روشنبیری / هەولێر ت ( ٢٢٦٥٨ )

مجموعة قصصية

الضيـاع



كمال سعدى مصطفى

نووسەر لەچەند دێڕێکدا :

★ لەساڵی ١٩٥٦ لەشاری هەولێر هاتۆتە سەر شانۆو دەوری مرۆڤـی دراوەتـێ لـە شانۆگەری ژیان •

★ فەرمانبـەر لـە ئەمینداریێتی گشـتی شارەوانی وهاوینە هەوارەکان •

★ ئەندامی نەقابەی هونەرمەندانە •

★ ئەندامی کۆمەڵەی وێنەگرانی عیراقە •

★ ئەندامی کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی کوردە لە هەولێر •

★ سەرباری ئەدەب خولیای هونەری تەشکیلیە •

★ بەهاوبەشی لەگەڵ چیرۆك نووس سـابیر ڕەشید لـەسـاڵی ١٩٧٦ شەش کورتە چیرۆکیان بەچاپ گەیاند •

نرخی ٥٠٠ فلسە

ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی ( ١٢٦٦ )ی سـاڵـی ١٩٨٤ •

چاپخانەی ڕوشنبیری / هەولێر

ت ( ٢٢٦٥٨ )